**بەم چاوەی:** بەو دیدەی .**بە لێشاوم:** بەو فرمێسکی وەک بـاران کە بە لێشاوله چاو دێتە خوارەوە. **بەم جەرگەی بیاوم:** بەم هەناوی بیاوم . کەسێ کە لە تاو شتێکەوە زۆر بە حەسرە ت بێت خۆی بە جەرگ بیاو دەزانێ و دا دەنێت .
**حال:** وەزع ،چۆنیەتی ، ئێستا .**پەرێشـان:** بێ سەروبەر، ئاوارە، شێواو. **بەم مالی:** بەم خانووەی،بەم دارایی ، هەرشتێکی کە هی کەسێ بێت.
**یماووم:** روخێندراوم،بەسەریەکاتەپێندراوم . خاپوورکراوم .
**پشتی قەفەس:** پشتی وەک قەفەس چەماوەبوو،پشتی چەماوە. **جێگەم:** شوێنم مەکانم **چۆکی شکاوم:** واتە دەستە و ئەژنۆکەوتووم و چۆکی شکاوم لە تاو موحەممەدا(د) .
**واچاکە :** وا باشە . **دەشتی:** نازناوی شاعیرە . **مەجنون:** دێوانە. شێت.
**موحەممەد:** مەبەست دوا پەیامبەری خوایە (د).

---

**مانا بە پشتی :**

ئەی دل وەرە باسی هێژایی و گەورەیی موحەممەدی پەیامبەری خوا بکەو هەمیشە بە بەلگەونیشانەکانەوە لە رێبازی موحەممەدەوە کە پیە لە پاکی و یەکێتی و خۆشەویستی داوای یاستی و ناسینی ئەو بکە،ئەوموحەممەدەی کە بوونەوەرانی ژێر دەریاکانیش وا لە مەدح و سەنای ئەوبەرێزەو گەورەیەوەن و شانازی بە ناوی ئەوەوە دەکەن ،خۆئەگەر موحەممەد نەبوایە ئەواخوای مەزن هیچ شتێکی لەم جیهانەوە وەدێ نەدەهەێناودروســـتی نەدەکردن .
موحەممەد شاهێکە کە پەیامبەری لە لایەن یەزدانەوەپێدراوە و بۆ بەختەوەری و سەرفرازی مرۆڤ نێردراوە و لە سەر تەختی گەورەیی و خوشەویستتیدا بێ وێنەیە،ئەم هەموو جیهان و ئاسمان و گەردوونە و ئەو کورسی و قەلەم و ئەرش وقویشە هەموویان دەست بە دوعاوەبوون ،کەخوا ئەو زاتە سەروەرەو مەزنە بێنێتە ئاسمـانەوە و بەچاوی خۆی زاتی خوا ببێنێ ،شەوی میعراجیش بەلگەیە بۆ ئەو هەموو گەورەیی وئەو یاستیانەی موحەممەدی پەیامبەری ئیسلام .
ئەی ئەوانەی کە گومانیانیان لەهێژایی وســەروەری ئەو مرۆیە مەزدنەیە هەیە بـا لە بەردە یەشەی مالی خودا بپرسن کە کێ بوو تۆی لە حەواوەوەستان و یای گرت ؟با لە مانگ بپرسێ کەوا کێ بوو بە هێمای ئەنگوستەکانیەوە تۆی ئاوا شەق کردو کردی بە دوو لەتەوە؟ کەوەرامەکەی شتێکی یوونە و دیارە دەلێن باوکی قاسمە کە نیشانەی ئەو هەموو گەورەیی و موعجیزانەیە،سا موحەممەدی پەیامبەری یەزدان (د) خاوەنی گەورەیی و پایەبلندیەکی بێ وێنە وبێ هاوتایە.
موحەممەد(د)لە لایەن یەزدانەوەبۆرزگاری وبەختەوەری مرۆڤەوە نیردراوە، کە یەکەمجار خوای مەزن داوای لە پەیامبەر کرد کەوا فێری خویندەواری ببێ،بۆ ئەو مەبەستەش ئـایەتی( ئیقرەء بسمی رەبیکەلئـەعلەم )ی بۆ ناردە خوارەوە، ئەو پەیامبەرەی کە هەموو خوو و رەوشتیکی لە یەزدانەوەیەو یابەری پاکی و چاکیە،

سا ئەی یەزدانی خاوەن لیٚ بوردن و دلۆڤان گیانم بکە بە قوربانی شویٚـــن پایی موحەممەد.

موحەممەد(د)گولزاری راستی و سەروەری و شادمانیە،ریٚبازی ئەو پیە لە رەیحانی بۆن خۆش وبەلاغەت و دلسۆزیٚ و خۆشەویستیٚ، یاگەیاندنی ئەو هەمووی پاکی وجوانیە، سایەی سەری ئەو شادی وخۆشیە، هەنگاوەکان و هاکارەکانی یارو یاوەران و میرەکانی موحەممەد(د)هەمویان شامیٚریە و یەفتارو هەلس و کەتی تەواوی هاوکارانیان هەمووی سەخاوەت و ئازایەتی و دلیٚری ومەردایەتی و سەربەرزی و شامیٚریە.

ئەی ئەو کەسەی کە گەورەیی و سەروەریت لە دەست و پەنجەکانت دا دیارەو کەوا یارو یاوەرانی تۆش لە ریٚبازی بیرو باوەیو هەلبژاردن داخۆیان سەرپشکن، ئەی ئەوەکەسەی کە بە یەحمەت و چاکەوە لە لایەن یەزدانی بەخشندەودلۆڤتنەوەلەناو دەفتەردا نوســـراوی ، بۆ دروست بوونی هەمووشتیٚک لەم گەردوونەدا موحەممەدە کە هۆی وەدی هاتـــنی هەموو بوونەوەریٚک و ژیانیٚک، ئەمانەش لە ئایات و ووتەکانی موحەممەد دا دیارن و روونە .جا من کە هەمیشە لە تاوان دەســـوتیٚم و هەناوم پییەتی لەخویٚن و ئاوور، وا بە چاوی پی لە فرمیٚسک و بە لیٚشاومەوەو بە جەرگی بیاو و لە ت لەتمەوە و بە حالیٚکی پی لە پەریٚشـانی و بە مالیٚکی یماوو خاپوورکراومەوەو وابە چۆکی شکاو و بە دەستەو ئەژنۆدا کەوتوومەوە،سا واباشەکە منی دەشتی ببم بە شیٚت و شەیدای موحەممەدی پەیامبەری خوداوە(د).

*

## ئەزانی خۆ

ئـەزانـی خـۆ چلۆن بێزارە ژینم یا ڕەســـــــولەللا
بە ئەشکی چاوەکانـــی پـڕ لـەخیـنم یـــاڕەســولەللا

سەگی بەردەرگـەهی تۆگەرچی ڕووی یەشبێ لەدونیادا
لە عوقبـــا بۆ شـــەفاعەت ڕوو زەمینم یـــا ڕەسـولەللا

ئـەگـەرچـی قـابـلی ڕەوزەی دەخـالـەت نیم بە قوربانا
دلی مـــن تابە جەزبی دا بـــە دیــنم یـا ڕەسولـەللا

لەدەرسی حیکمەتا حیکمەت دەزانم من نەکـەم هـاوار
کە لەم باغی گولەت جارێ نەبـیــنم یــا ڕەسولـەللا

مـــنی پڕ فیتنە هەردەم ئــــاووری زاریمـە بـۆ دیتن
عـەجـەب بۆ دیتـــنت دێتن ئەنیـنم یـــا ڕەسولـەللا

بە هیجری فیرقەتت تەندوورە ســینەم وەسلی دا بــەڕوو
کەبەعدەل عوســری یوســـری بوو یەقینم یـــا ڕەسولـەللا

بە ئەولاد و سەرو مالی بـــە قـوربـــانت ببێ دەشــــــتی
بـە نیوقوربـــانی بـــۆم نـاچێ ئـەمیــنم یـــا ڕەســولەللا

---

**مانای وشەکان:**

ئەزانی خۆ: خۆ دەزانی ، بە یاستی ئاگات لێیە .چلۆن: چــۆن ، کوو ، بەچ شێوەیەک . ژینم: حەیاتم ، مانەوەم . یـــا یەسولەللا: ئەی پەیامبەری خودا.

بە ئەشکی: بە فرمێسکی، بە ئەسرینی .چاوەکانی: دیدەکانی. پی: تەژی ، مشت لەخینم:لە خوێنم ، لە خوونم . یـــا یەسولەللا: ئەی پەیامبەری خودا.

سەگی : سەی ، کسۆکی . بەردەرگەهی تۆ : بەر دەروازەی تۆ. گەرچی:ئەگەرچی هەرچەندە. یووی رەش بێ:گوناهبار بێ ، یووسیابێ . لە دونیـــادا :لە جیهاندا، لە ژیاندا .

لەعوقبا:لەیۆژی جەزا ،لە یۆژی قیامەت ،لە یۆژی وا پەسین. بــۆ:لەبۆ،لە پێناو. شـــەفاعەت:پایانەوە لە یەزدان بۆ لێ بوردن لە گوناهان .یووزەمینم :یوو بەرە وخاکم مل کەچم. یـــا یەسولەللا : ئەی پەیامبەری خودا.

ئەگەرچی: گەرچی ،هەرچەندە.قابلی: شایانی . یەوزە:گولزار، باغ ، گولستان میرغوزار،زەنوێر،بە مانای داواش هاتووە . دەخالەت: دەخیل، بە پەناهەندەبوون لەبەرکەسێ پایانەوە . نیم:نیمە، ئەمن ئەوەندەنیم ،لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە لەوە کەمترم خۆم دەخیـل بەپـــەیـــامبەر بکەم.بەقوربانا:قوربانێت بم گیانم پیشکەشت بێ .

دل: قەلب . تاب:رۆشنایی ،گەرمی ، هێز و توانابوون ، جۆلانەوە. جەزب:راکێشان بۆ لای خۆوە .بە دینم : بە ئاینم بە بیرو باوەیم . یـــا یەسولەللا:ئەی پەیامبەی خودا.

لەدەرسی: لەوانەی.حیکمەت:فەلسەفە، یاستی زانیاری ،زانست و ئاگاداری لە شتی یاستدا. دەزانم: ئاگادارم . من: ئەمن ،خۆم . نەکەم : ئەنجام نەدەم هاوار:دادو فیغان ، گریە و زاری، بە بلندی دەنگ دەربیین .

کە:بەیاستی . لە:لە ناو.باغی گول:گولزار،باخچی گولان . جارێ: یەکجار،هێشتا نەبینم:پێی شاد نەبم،چاوم پێی نەکە وێت . یـــا یەسولەللا:ئەی پەیامبەری خودا.

منی:ئەمنی،ئەزی.پـی:تەژی.فیتنە:ئاشوب،بەلا،شەی،سەختی. هەردەم: هەمیشە ، هەموو کاتێ . ئاوور:ئاگـر .زاریمە: گریانمە . بۆ:لەبۆ دیتن:دیدار چاوپێکەوتن .

عەجەب:سەیر،سەرسویمان ، چلۆن ،بەشێوەیەکی نا ئاسایی . بۆدیتنت: لەبۆچاوپێکەوتنت و دیدارت دێتن:دەهێ،دێ. ئەنینم: هاوارم شین و زاریم . یـــایەسولەلل :ئەی پەیامبەری خودا.

هیجر:دووری ، جودابوون لە کەسێ .فیرقەت :جودایی،کۆچ . تەندوور: تەنووری ئاگر . سینەم:سینگم. وەسلی: گەیشتن . بەیوو: بە وەجە، بە دم و چاو

کە:بەیاستی.بعد:دوای.پاش عوسر:ناخۆشی.یوسر:خۆشی . بوو: هاتەکایەوە.یەقین:باوەیی یاست .یایەسلەللا:ئەی پەیامبەری خودا.

ئەولاد:مندالان.سەر:رەئس. مال:دارایی . قوربان: فیدا، پیشمەرگ . بێ:بێ ،بێتن دەشتی :نازناوی شاعیر.

بە نیو:بەنیوە ،یان بە نێو:واتە بە ناوی قوربانی ناوی لێ ناندرێت. قوربانی:خۆبە قوربان کردن،گیان لە ڕێ دانان. بۆمناچێت: بۆم ناژمێردرێت،نابێتە قوربانی دان. ئەمینم:ڕاستگۆم . یارەسولەللا: ئەی پەیامبەری خودا.

مانا بە پشتی:

ئەی پەیامبەری خودا تۆ چاک دەزانی کەوا من چەندە بێزارم ولەم ژیانەی دووری لەدەروازەی تۆی خۆشەویست وسەروەر دا،وا بەئەسرینی چاوەکانمەوە پێمەوە دیارە کەوا هەمیشە پی لەیەنج و ئازاروگریە و زاریمە.خۆ ئەگەر سەگی بەردەروازەی تۆ لەجیهانیشدا پی لە گوناهــان و یووشی یەش بێتن ،بەلام ئەی خوشەویست و پەیامبەری خۆشەویستی خودا، لە دوا یۆژی لێ پرسینەوە دا بۆ داوای لێ بوردن لە گوناهانم لە تۆ داواکارم و یوو بەرە و خاکم و لێتان دەپاڕێمەوە کەبە هۆی داوای لێ بوردنی تۆ خوای مەزن لێمان خۆش بێ و بمان بورێت.هەرچەندەش شایستەی ئەوە نیم کە خۆم بکەم بە قوربان و لە گولزاری خۆ دەخیل کردنی تۆدا بم بەلام ئەی پەیامبەری خودا خۆ ڕۆناکی و گەورەیی و هێژایی تۆلە ناو دل و دەروونی منداگەلێ مەزنەو بە بیرو باوەیی ڕاستەقینەمەوە داوای شەفاعەت لەتۆ بــۆ لێ بــوردن م لێت دەکەم.من لە دەرسی فەلسەفە و حیکمەت دا ئەوە بەیاستی دەزانم کە لە دیدار و چاو پێکەوتنی مەزاری پیلە گول وگولزاری تۆدا ئارام بم و هاوار و یۆیۆ نەکەم، ئەی خۆشەویست و پەیامبەری خودای مەزن.منی پر لە گیرو گرفت و ئازار هەمیشە بۆ دیدارت گریە و زاریمە و بۆ چاو پێکەوتن و زیارەتت، وا بە سەر سویمانەوە خوینم لە چاوان دێتە خوارەوە، ئەی پەیامبەری خوادا،وا لە تاو جیابوونەوەو دووری لە مەزاری تۆوە سینەم پی ئاتەش بوەو خەریکە ئەو ئاگرە دەگا بەیووم و گیو گلپەی وا دەمسوتێنێ، بەلام باوەیم وایە کە لە دوای هەموو ناخۆشیەک دا خۆشی دێتن و ئازارو یەنج دەبیێنەوەو جەفاو میحنەتەکان نامێنێن، ئەی پەیامبەری خودا،هەرچەندە کە دەشتی بە هەموو خاو خێزان و مال و مندالانیشیەوە ببێ بە قوربانی تۆ هێشتان هەر کەمەو بۆم نابێتە قوربانی و ناوی قوربانی بوونی لێ ناندرێتن، ئەی خۆشەویست و پەیامبەری یەزدانی مەزن .

*

## تاجی ئیستقلال

ئەی عـــــێراقی بێکەس و پڕ لە ئێش و دەردو خـەم
وەی ئەســـــیری حەربی نایێکی لە مەیدانی بـەتەم
حەیفـە پاشی تـۆ بمێنن کـوردەکانی بێ حەشـــەم
چوولەدەســــــتیان مەعدەنی عیززوشەڕەف بەینەلکەیەم

ئـــەی گەلی ئەشـرافی کوردان بـۆ غـــەریقی زیللەتـن
بـۆچـی وا دائیم خەریـــکی قـــووتی مولک و میللـــەتن
بـــۆچـی وا دەعیە و تـەکەببـور لێ ئەدەن پڕحیـددەتن
چـاکـە شـــــەرمێکەن لەعالەم سـەربەخـۆ کاکن لەدەم

مەرکـــەزی خـاکی ســـــلێـــمانی خیانەت تێـکی دا
خۆبەخـــۆ هەرچـی کەهات و قووەت و قـــەولێکـــی دا
تـاجـی ئیسـتقلال بێ ســـــــەر چوو چ نەفعێکی نەدا
چەققە لولـە و بابەڕۆ پـشـــتم شـــــکا ڕۆژی نـەدەم

کوا ڕەئیسی جـــــاف و هەم کوا میرەکانی پـشت گەلی
ئیجتماعی میروسوو کـوانی لـــەگـــەل مـیرمـەحمـەلـی
کوا هـەمــاوەند و شـــــکـاک و بۆتـەکانی گەنجەلـی
چەند کەسی تـر هەن کەئەمـڕۆ نـانی دەریۆزەی لـەدەم

هەرکەسێ هات و بەدیعـی سـەنعـــەتی بـــوو نـاویدا
خـــاکی ئێوەی کردە پـــــاپۆڕ و لـە بەحـرا ناویدا
مەکتەبی لاســـلکی دانا نـــەفـعـــی بێ ئەنـــدازیـــدا
تابەکەی ئێوەش لـەجەهلا دائەدوورن پووشی سـەم

بابەگوڕگـوڕ تاوەکوو ئێسـتاکـە پـیری ئێـوە بـــوو
خـانـــەقـاو و تـەکیەو و ڕێبـــــازی شـیخی ئێوە بوو
جێگەیی مـــەولوود و سەد ئیحسان و خێری ئێوە بـوو
ئێستاش واپـێ خەنی بوون عارەب وتورک و عـەجـەم

چـاکە فـکرێکەن لە ئیســـتقبالی خــۆ زوو چـارەکـەن
تەرکی وەحشەتکەن سیلاحی یەکدی کوشتنن پـارەکـەن

ڕوو لەپـەیدا کـردنی ئـــــالاتی وەک تــەیـیــارەکەن
تــاوەکو دەشتی نەبێ مـەشـــغولی قـــال و قیلی خـــەم

**مانای وشـەکان**

**ئەی:** وشەی بانگ کردنە، هاوارە لە دەست داخ و یەنج وکولیدا.**عیراق:** وەلاتی ئێراق.**بێکەس:**تەنیاو بێ هەڤال ودۆست و کەس .**دل پڕ:**دل تەژی،بە تایبەتی بۆ خەم و ئازار دەگوترێ .**خـــەم:** پەژارە . **وەی :**ئەی ، وتەی هاوارە لە دەست ژان و ئێشدا.**ئەسیر:**زیندانی ،کەسێ کە لەشەیدا بگیرێ ، یان بە هەر شێوەیەکی تر دەستی بە سەردا بگیرێت بەندبکرێت و چەوساوە بێت. **حەیب:** جەنگ ، شەی.**نارێکی :**یەکتر نەگرتن، نەبوونی یەکێتی .**مەیدان:** ناوەند،چەق ،هەلێر . **بەتەم:** بە خەم ، تاریک ،بە پەژارە.

**حەیف:**مخابن،وشەی سووبوونەوەیە .**پاشی:** لەدوایی .تۆ راناوی دوەم کەسە.**بمینێن:**بژین ،لە جیهاندا بێت. **کوردەکان:** گەلی کورد.**بێ حەشەم:** بێ هێز،بێ لەشکرو سوپا.

**چوو:** رۆیی. **لەدەستیان:**لەکیسیان، لە چنگیان .**مەعدەنی:**کانی ،سەرچاوەی. عیزز:گەورەیی ،سەروەری .**شەرەف:**یوومەت ، یووسۆری . **بەیـن :** نیوان ، ناوەند .**کەیەم:**سەخاوەت .

**ئەی:**وتەی بانگ کردنە ،بۆرەنج و ئازار ئێش دەگوترێ . **گەل:**شەعب،میللەت خەلک. **کـــوردان:**خەلکی کـورد،**بۆ:** لەبەرچی.**غەریقی:**نوقمی،خنکاوی.**زیللەت:**پەستی،سەرشۆیی.

**بۆچی:** لە بەرچی،چما ،لەبۆ ،لۆچی .**دائیم:**هەمیشە هەردەم . **خەریکی:** مەشغولی ،لەدوای . **قووتی:**خواردن ،نانی رۆژێک ،ئەوەی کەمـــرۆڤ دەیخوات ئەو خواردنەی کە تەنیا بەشی ژیانی یۆژانەیە و مرۆ پێی دەژی . **ملک:**مال،ئەودارایيە یان ئەو خاکەی کە تایبەت مەندە بۆکەسێک و خەلکی تر مافیان پێوە نیەلە بەکار هێنانیدا.**میللەت:** گەل ،شەعب .

**وادائیم:** هەردەم ئاوا، هەمیشـە ئاوا .**دەعیە:** فییز ، خۆ بە زۆر زانین و چوننا، روح گەورە .**تەکەببور :** دەعیە ، روح گەورە. لێ **ئەدەن:** ئەکەن ،ئەنجامی ئەدەن،دیاری دەخەن .**پـیحیددەتن:**تەژی توندو تیژی،پی غەزەب وتوویەیی .

**چاکە:**واباشەاخاسە . **شەرمێکەن:**حەیابکەن ،شوورەیی بکەن. **لەعالەم:** لەجیهان،لەخەلکان ،لە دونیا.**سەربەخۆ:** ئیستقلال، بوونی وەلاتیکی سەربەخۆ .**کا:** کوانی لە کوێیە ،چی وەسەر هات ، **کین :** قین ، تویەیی دژایەتی یەکتری کردن .**لە دەم:**لە خوێن ، لە گەل یەکتر،یان بەزار .

**مەرکەز:** هەلیر ،چەق ، مەیدان.**سلێمانی :**مەبەست شاری سلێمانیە لە رۆژگارانی شیخ مەحمودی نەمردا کە کورد یەکی نەگرت و نەبوو بە هیچ .

**خیانەت:** خوفرۆشی و چوونە پاڵ دوژمنانەوە دژ بە گەل و نیشتمانەوە، فرت و فێڵ لیک کردن و جاشیەتی کردن .**تێکیدا:** لە ناوی برد، نەی هێشت ،خاپووری کرد .
**خۆبەخۆیی:** لە گەل یەکتری.**هەرچی:** هەرکێ،هەرکەسێ . **کە هات:** کە هاتن ،وەدەرکەوتن ،کە گەیشت .**قوووەت:** هێز ، توانا . **قەولێکی دا:** وادەیەکی دا.پەیمانێکی دا.
**تاج :** ئەو کلاوەبە نرخەیە کە پادشایان لە سەریان دەکەن ، ئیستقلال :سەربە خویی لێرە مەبەست لە پادشایی کردنی شیخ مەحمودی نەمرە کە بە هۆی نایێکی و
دژایەتی یە کترکردنی کورد و نە بوونی یەکێتی تاجی سەربەخۆیی و پادشاهی لەدەست چوو. **چ نەفعێکی نەدا:** هیچ سودی نەبوو،بەخۆیایی یۆیی .
**چەققەلولە:** مەبەست چەقەچەقی بێ سودە،مشت و میی بێ کەلک،زۆرگوتن و گوفتای نا بەجێ گوتن **بابەیۆ:** داد وهاوارکردن ، گریان و فیغان .**پشتم شکا:** ئەم وشەیە لە دوای خەم و خەفەت و زەرەر و زیانێکی زۆر گەورە، یان مردنی ئازیزێک دەگوترێ کە مرۆ بە چاوی خۆی دەیبینێ و هیچ چارەیەکیشی نیە .**رۆژی نەدەم:** کاتی پەشیمان بوونەوە.
**کوا:** لە کوێن، کوانێ.**یەئیس:** سەرۆک ، رابەر، سەرکردە. **جاف:** ناوی هۆزیکی گەورەی کوردە. **هەم کوانێ:** هەروەهالە کوێن. **میرەکان:** ئەمیرەکان،سەرکردەکان **پشت گەلی :** ناوی بەرەبابێکی هۆزێکی کوردانەو مەبەستیش ناوچکانی ئەودیوی گەلی عەلی بەگە،واتە ناوچەکانی بارزان و برادوست و رەواندوزو بالەک و بەولاوە،یان مەبەست گەورە پیاوانی پیشتیوانی میللەتە.
**ئیجتماع:** کۆبونەوە،دانوساندن.**میروسو:** ناوی بەرەبابێکی میرەکانی ناودارای کوردی حۆشناوەتی.**کوانی:** لە کوێن .**لەگەل:** بەیەکەوە، لە تەک یەک .**میرمەحمەل:** ناوی بەرەبابێکی میرانی خۆشناوەتیە.
**کوا:** لەکوێن.**هەماوەند:** ناوی هۆزیکی کوردە.**شکاک:** ناوی هۆزێکی کوردە.**بۆت:** ناوی هۆزێکی کوردە.**گەنجەلی:** ناوچەیەکی بۆتەکانە،کە لەدیرۆکی کوردەواری دا گرنگیەتی تایبەتی هەیە.
**چەند:** زۆر،پی،فرە،گەلێ.**کەسی.تر:** خەللکی تر. **هەن:** مەوجودن ، هەنە.**نانی دەریۆزە:** نانی دەرۆزەکردن و پایانەوە لەبەر بێگانەکان. **لە دەم:** لەزار،لە دەو **هەرکەسێ:** هەرکێ.**هات:** گەیشت،داگیری کرد.**بەدیع:** جوانی ، تازە ،زانینێکە کەبۆ جوان کردنی گوفتارو نوسینی راست ودروستە. **سەنعەت:** پیشەسازی. **ناوی دا:** ناوبانگی دەرکرد.
**خاک:** نیشتمان، وار، ئاخ، وەتەن.**ئێوەی:** ئەنگۆی. **کردە پاپۆی:** کەشتی لێ دروست کرد .**بەحر:** دەریا. **تاوی دا:** رەونەقیدا،غاریدا،رۆشناییدا.

**مەکتەب**: نوسینگە. **لاسلکی**: بێسیم . **دانا**: هینایە کایەوە .**نەفع**: سو،قازانج. **بێ ئەنداز**: بێ سنور، یەکجار زۆر.

**تابەکەی**: هەتاکەنگی،هەتاکەینێ. **ئێوەش**: ئەنگۆش ،هون . **جەهل**: نەزانین،نادانی نەبوونی ئەقل. **ئەدورن**: دەدورن ، وەدەست دێنن. **پوش**: پوش و پەراش کە هیچ بەرو بومی نیەو بێ سود و بێ کەلکە. **سەم**: ژەهر.

**بابەگویگوی**: ناوی ئەو گیە سوورەیە کە لە شاری کەرکوکی دلی کوردستانەوە دەردەچێت و سەر چاوەیەکی مەزنی کانی نەوتەکانی کوردستانە،بابە گویگوی هەر لە کۆنەوە لە ناو کوردەواری شوێنێکی پیرۆز بووە لەو یۆژگارانە دا کە عەرەبێک لەو ناوە دا نەبووە،تەواوی ئەو گیە ئاگرانەی کە لە بیرە نەوتاویەکانی شاری زێیینی کەرکوکی دلی کوردستانەوە هەل دەقولێت لە دیر زەمانەوە بۆ گەلی کورد پیرۆز بووە و شوێن و زێدی گەورە پیاوان و ماقولان و پیرۆزیی گەلی کوردەوارییە و زیارەتگاوهەوارێکی زۆر پیرۆزە کەوا ئێستاکە دوژمنانی داگیرکەری کوردستان بە زۆری زۆرداریان داگیر و تەعریبیان کردووەو خەلکی کوردەواریان لە تەواوی ئەو ناوچانەو شاری دیرینی کەرکوکی دلی کوردستانەوە ئاوارەو دەربەدەر کردووەو عەرەبەکانیان هێناوەتە شوێنی باوک و باپیرانمانەوە .**تاوەکو**: هەتاکو. **ئیستا**: هەنوکە، ئێستاکە،ئەلئان. **پیری**: گەورە،پیاوچاک ماقولان، زیارەتگا. **ئێوە**: ئەنگۆ،هوون،کە مەبەست گەلی کوردە.

**خانەقا**: کاروانسەرا،شوێنی خەلک،مزگەوتی گەورە .**تەکیە**: شوینی شیخ وەمەلاوسوفی و دەروێشان، نیایشگا. **رێباز**: یێیەو،رێگا . **شیخ**: گەورە.

**جیگە**: شوێن .**مولود**: خێروخێرات کردن، **ئیحسان**: چاکەکاری. **خێر**: باشە،ناندان و چاکەکردن. **ئێستاش**: هەنوکەش. **خەنی بوون**: دلخوش بوون ،شاد بوون. **عارەب**: تازی ، میللەتی عەرەب. **تورک**: قەومی تورک،ئازەر. **عەجەم**: فارس ، غەیرە کورد.

**چاکە**: واباشە .**فیکرێ**: بیرێ،هەستێ ..**ئیستقبال**: دوا رۆژ، ئایەندە. **زوو**: بەپەلە. **چارەکەن**: چارەسەری بکەن ، بدۆزنەوە.

**تەرک**: وازهێنان،دورکەوتنەوە. **وەحشەت**: ترسناک،نەزانی وترسناک **سیلاح**: چەک. **یەکتر**: خۆبەخۆ، یەکدی. **کوشتن**: لە ناوبردن. **پارەکەن**: لەت کەن، بشکێنن، لەناوبەرن،مەیهێلن.

**روو**: بەرەو،وەپیرەوەچوون،بۆ لایۆیشتن. **پەیداکردن**: وەدەست هێنان .**وەک**: وەکوو. **تەییارە**: فرۆکە، هەواپەیما.

**تاوەکوو**: هەتا. **دەشتی**: نازناوی شاعیی نیشتمانپەروەر مەلا خدری نانەکەلیە،کە بەمەلاخدری دارەبەنیش ناوی دەرکردووە. **مەشغوول**: خەریک .**قـال وقیـل**: بەند و باو گۆتن و لێک دانەوە، گوتنی باوەی پێ نەکراو،واو وەهالە گۆتن. **خەم**: پەژارە.

دەشتی وەکو هەموو مرۆیەکی نیشتمانپەروەر هەرگیز واری شیرینی خۆی لە بیر نەکردووە و هەمیشە دلسۆزانە و کوردپەروەرانە بە یاری شیرینی خۆی دا کە کوردستانی یەنگینیا هەلگوتووە و بەو پەیی خۆشەویستیەوە پەرۆشی ئەو هەموو زولم و زۆر و داگیرکردنی نیشتمانی خۆیەوە بووەکە بەیاستی لێک دانەوەو شێ کردنەوەی ئەم شیعرە نیشتمانیەیەی دەشتی بۆ ئەوە دەبێ کە چەند کتێبێکی لە سەر بنوسرێتن بەزێی بنوسرێتەوە.

---

مانا بە پشتی

ئەی عیراقی پی لە خەم و پەژارە و رەنج و ئازارو بێکەس، ئەی گێرودەی داوی شەیی نارێکی ودژ یە یەکتری وخۆکوژی کە لە ناو تەم و پەژارەدا تەژی نەهامەتی و نائارامین، سەد حەیف و مخابنە کە گەلی کورد ئاوا بێ لەشکر و بێ هێزهەر ئاوا ماوەتەوەو هیچ ماف و توانایەکی نەتەوایەتی خۆی نیە، ئەو کوردەواریەو نەتەوەیەی کە سەرچاوەی سەروەری و گەورەیی و بەخشینیان لە کیس چوو وچارەنوسیان لە دەست خۆیانەوە نیەو بێ ژیانی ئازادی و یزگاری و سەربەخۆیین و هەمویان لە دەست رۆییوە،دەسا چاک بیر بکەنەوە، ئەی گەلی ماقولان و گەورە پیاوانی کورد لە بەرچی ئێوە ئاوا نوقمی پەستی و لە ناو بردنی هەموو دارو نەدارێکی خاک و تەواوی میللەتی خۆتاتن بـۆچی ئاوا مـەغرووری و نالەباری و پیلە فێزی پیشەتانە و ئاوا پی لە ترس و بێباکـن لە بەسەرهات و یوداوە نالەبارەکانی یۆژگارانی خۆتان،هەتا کەینێ هەر ئاوا دەبن، بەسیەتی،وا باشە کە شەرمێک لەم جیهانەو لە م یۆژگارانەدا بکەن و لە پێناوی سەربەخۆیی و یزگاریدا تێ بکۆشن و هەولێک بدەن ، وا هیوای ئازادی و رزگاربوون و سەر کەوتنی بزوتنەوەی ئازادیخوازی لەسلێمانیدا(کە مەبەست شۆیشی شێخ مەحمودی نەمرە ) بە هۆی خیانەتی خۆبەخۆ لێک کردن و تەفرەقەو نیفاقەوە تێک و لێک دراو لە ناو چووو نەما، وا هەرکەسێکی کە هات و توانای هەبووو شتێکی بۆ گەلی کورد پێ دەکرا، تەنیا وا بە سەرزارەکی وادەیەکی داو هیچیشی بۆ ئێوە جێ بەجێ نەکردو لێتان هەلگەیایەوە، هەر بۆیەکەشە کەئاوا تاجی سەربەخۆیی و رزگاری رۆیی و لە دەستتان چوو و نەما، ئیـترهاوارو یۆیش لە دوای پەشێمانیدا هیچ سودو دادێکی نەدا،ئەدی کوانی و لە کوێن؟سەر کردەکانی هۆزی جاف و گەورە پیاوانی پشت گەلی؟کوانێ کۆبوونەوەکانی میر مەحمەلی و میر وسـوو چیان وەسەر هات بۆ کوێ چوون؟هەمەوەندەکانی خاوەن تواناو هێز و شکاکە شۆیشگێیەکانی ئازاو دلێو نۆتەکانی ناوچەی گەنجەلی و شێرەپیاوانی یۆژگارانی کوردەواری چیان وەسەر هات و ئێستاکە لەکوێن؟ خۆ وا گەلێ کەسی تـــریش هەن ئێستاکە دەبینین نانی پایانەوە و دەرۆزە کردنیان لە خەلکانی تر و بیانیانی داگیرکەر بووەتە قوتی ژیان و بەدبەخت و چارە یەشن و مال و حال لێ داگیرکراون و سەر لێ شێواو بەبێ هەموو مافێکی ژیان و بەش

خوراون،هەربیگانەیەکی کەوا هات و لە وەلاتی ئێمەداکە کوردستانی شیرینە بە هۆی زیرەکی و پێشکەوتنی پیشەسازی خۆیانەوە ناویان دەرکرد و خاکی ئێوەیان داگیرکرد و هەموو سەروەت و سامانێکی ئێوەیان دزی و بە کەشتیە زلەکانیانەوە لە دەریاوە هاتن و هەموویان بە تالان بردو دزیان ،نویسینگەی بێسیمەکانیشیان بۆ پەیوەندی کردن بە وەلاتانی دووری خۆیانەوە داناو زۆر زۆریان سود لە خاکی کوردەواری دا وەرگرت و دارایی ئێوەیان هەموو دزی وبردیانن و فیاندیان بۆ وەلاتانی خۆیانەوە، ئێوەش وا لە دوا کەوتویی و نەزانین و مال وێرانی و تێ نەگەیشتن و بیر تەسکی خۆتانەوەدا چادری بێ سـود و بێ کەلک هەلدەدەدەن و ژەهری نەزانین و تەفرەقـــەو نیفاق دەچێنن و پووشی بێ بەروبووم و ژەهراوی دەدوورنەوە کە هیچ سودێکتان پێ ناگات و چیتان تیادا نیە،ئێوەی کە تا ئێستا خانەدان وپیاو ماقولان بوون و خاوەنی بابە گویگویتان بوون،ئەو بابە گویگویەی کە شوێن وجێی سەربەرزی وشانازی و گەورەپیاوان و ماقولانتان بوو، شوێنی خانەقاو تەکیە و رێبازی شێخ و سەروەرانی ئێوە بوو،شوێنێکی پیرۆزو گی لە خۆشەویستی وجێی سەربلندی وشانازیتان بوو،وادەبینین کە لەدەستتان چوووەو بۆ ئێوە نەماوە،دەسا ئێستاکە بیواننو باش بیر بکەنەوە کەوا چۆن عارەب و تورک و عەجەم بە سەروەت و دارایی و داهاتی ئێوەوە شاد و دەولە مەند وخەنی و دلخۆش بووینەو کەرکوکی دلی کوردستانیان لە ئێوە زەوت کردووەو داگیریان کردووە،سا ئەی کوردینە بەسیەتی هەتاکەینێ ئێوەش ئاوابەم شێوەیە دەبن وهەر ئاوا دەمێننەوە، وا چاکە کەئێوە زۆر بە زوویی بیرێک لە خۆتان بکەنەوە و زۆر بە چاکی و وردبینی بنواینە دوارۆژی خۆتانەوە و چارەیەک لە ژیان و گوزەرانی وەلاتی خۆتان بکەن و خۆتان یزگارو ئاسودەو سەربەخۆ بکەن،بەسیەتی دژایەتی یەکترکردن و بیری تەسک و هەستی یەکتر کوژی وخۆخۆری و خیانەت لە یەکتر کردن واز بێنن و یاپەین،وەرن هەموو لە هەموو بە یەکەوە چەکی بەدبەختی و یەکترکوشت و بیرکردنەوەی بێ سود و تەنگ و تریسک فیێ بدەن و بۆ هەمیشە لە ناوی بەرن و نەفرین لە دژایەتی یەکترکردن بکەن و یەکگرن و یەکێتی پیزەکانتانپتەو بکەن لە پێناوی ژیانێکی بەختەوارانەو سەربەخۆیی نیشتمانی خۆتان بە یاستی هەول بدەن،وەرن یوو لە پەیداکردنی فرۆکە و جبەخانەو تەکنەلۆژیای تازەو سەنعەتی نوێ و بکەن و خۆتان و وەلاتی خۆتان پێ بپـارێزن و دلسۆزانەو سەربەرزانە لە پێـناوی ئازادی و رزگاری و ســەربەخۆیتان خەبات بکەن و یاپەین وبە سەربەرزی تێبکۆشن،تا دەشتێش چیتر خەریکی ئازارو رەنج و خەمی ئەم و ئەوی نەبێتن و هەموو پەژارە ومیحنەت و ئازارەکانی لە ناو بچێتن و بە دل ئارامی و ئاسـودە یی و بێخەمی بژیتن و کوردەواری یزگارو سەربەخۆ و ئازاد ببێتن .

*

دەشتی وەکو نیشتمانپەروەرێکی زاناو دلسۆز و بە وەفا بۆ خاک و نەتەوەکەی خۆی هەستی بە دوا کەوتویی و نەزانین و گیانی دوبەرەکێ و نیفاق و بێگانە پەرەستی کردوە و زۆر بە دلسۆزانەو خاک پەروەرانە داوای لە یۆلەکانی گەلی کورد کردووە کەوا یەک بگرن و تەنیا یەکگرتن و یەکێتی نێوان میللەتانە کە دەبێتە هۆی یزگاری وسەربەخۆیی خاک و نەتەوەکان،دەشتی دژی شەیی کورد کوژی و نەزانین و دواکەوتوویی میللەتی کورد بووە ئاخ و کەسەری ناو دلی دەشتی هەست کردن بە نەبوونی گیانی پاکی کوردایەتی و خۆشەویستی یەکتر وبێگانە پەرستی گەلێ لە یۆلەکانی میللەتەکەی بووە،لە دەور و یۆژگارانی خۆی دا ئەم خەسلەتەی میللەتەکەی هەست پێ کردووە وهەمیشە یەنجی داوەو خەمی پێوە خواردووە ، ئەم خەسلەتانەی بەهۆی هەرەمەزنی نەبوونی وەلاتێکی سەربەخۆی کوردەواری زانیوە، دەبینین لەو شیعرەی سەرەوەی دا چەندە دلسۆزانەو کورد پەروەرانە باسی یەکگرتن و خەبات لە پێناوی کورد و کوردستان دەکاتن و نەفرین لە شەیی خۆکردن دەکاتن و شەیی خۆ کردنی بە هۆی نەبوونی وەلاتێکی کوردەواری و دوا کەوتن زانیوە کە سالەهای سالە ژێر دەستی یۆم و عەجەم و تازیانین،کە هەمیشەداوای لە گەلی کورد کردووە کەوا بەسیەتی و یەکتر بگرن و لە پێناوی کوردستانێکی سەربەخۆ دا خەبات بکەن چونکە یەکتر گرتنی کوردو زانین و زانیاری سەرچاوەی سەرکەوتن و یزگاری و سەربەخۆیی کوردستانەو هەرمیللەتێ کە یەک نەگرێتن و نەزان و سەر لێ شێواو بێت بەرامبەر داگیرکەران و نەیارانی هەرگیز سەربەخۆ و شاد و بەختەوەر نابێتن و نابێ بە خاوەنی وەلاتێکی ئازاد و یزگار کراو پێشکەوتوو،داوا لە گەلی کورد دەکاتن کە هەول بدەن تەکنەلۆژیاو تەکنیکی تازە وەدەست بێنن و گەلی کوردیش وەک تەواوی گەلانی جیهان با بۆ خۆی خاوەنی وەلات و سەربەخۆی و یزگاری و ئازادی بێتن و بەرەو پێشەوە بیوات و هەر ئاوا نەبن لە ژێر چنگی داگیرکەران دا بچەوسێنەوە و نەزانین دوا کەوتوویی بەشیان بێتن،بەسیەتی کاتی سەربەخۆیی و یزگاری هاتووە ئەوەش بە زانین و بەرەو پێشەوە چوون و یاپەیین وەدەست دێتن.

هەزاران سلاو لە گیانی پاکی دەشتی مەزن و هێژاو هەموو نیشتمانپەروەران و دلسۆزان و سەروەرانی کورد و کوردستان.

## ئەی شاهی سلیمانی

ئەی شاهی سلێمانی بێ باب و کەست کردین

بۆ لەو دەمە یەکجاری بێ خزم و کەست کردین

میهمانی ئەجەل قابیز قابیل نیە لاداتن

بۆیێکەلەڕەوزەی خۆت بێ پاو و دەسـت کـردین

ئەولادی عەلی بـووی و کەڕاڕی زەمـــــانی خـۆت
وابەم یەک سەفەرەت بێ کەیف وهەوەست کردین

فەخـری عەرەب وتورک و کـوردو میلەلی تـربووی
بێ ڕوخ وبێ شاە و بێ ئەسپ و فەڕەسـت کردین

ئەی باوە ئەتۆ بـابـی ئێـمە فـوقەڕا بـووین سـا
لەم ڕۆژەوە لەهەرجێ یەس بێ جەڕەســت کردیـن

مەعـلوومـە کەتۆ(...... ..)کە بنـالێــــــــنین
بۆدەردی دلی سەدکەس بـێ هەوەســت کـردین

تــاریخی وەفــــاتی تۆم دانا بـە(سمیغش)بـوو
هاوارە هەموو شارو دەشتی کەبەسـت کـــردیـن
*

---

## ماناى وشەكان

**ئەی** :وشەی بانگ و هاوار کردنە،شاە: مەلیک .سلیمانی: شارێکی خۆش و دلگیری کوردەواریە و شاری هەلمەت و قوربابیە،شیخ مەحمودی نەمر لەو شارە قارەمانەدا حوکمیانی کردوە،سلێمانی دەکەوێتەخوارووی یۆژهەلاتی کوردستانی باشور. **بێ باب**:بێ باوک، بێکەس. **کەست کردین**:بێ کەس و کارت کردین،بێ خزم و کەس ماینەوە. بۆ:لەبەرچی، **لەوددەمە**:لەم کاتەدا، لەم وەختەدا.**یەکجاری**: بۆ هەمیشە. **بێ خزم و کەست کردین**:بێ کەس و کارودوست و یارت کردین .
**میهمان** :مێوان .قابیز: روحکێش ،عیزرائیل. **قابیل نیە**: رەوانیە.شایستەنیە **لاداتن**:وەلا بچێ لێ گەیێ .
بۆیێکە: لەبەر هەندێ . **رەوزە**:گولستان،گولزار.**خۆت**:تۆ.**بێ**: بەبێ.**پا**:ئەندامی تەنی ئینسان و حەیوان کە بە هۆی ئەوەوەبەیێ دا دەرۆن ،پێ. **دەست**:ئەندامی جەستەی مروڤ لە شان تا سەر ئەنگوستان .**ئەولاد**:رۆلە،کوی،فەرزەند.**عەلی**: مەبەست ئیمـام عەلی یە،**کەییار**:زۆرهێرش کەر لە شەیدا . **زەمانی خۆت**: یۆژگاری خۆت،کاتی خۆت. **بەم یەک**:بەم جارە،**سەفەر**:مال ئاوایی کردن لە جیهان،بەسەفەرچوون بۆ هەمیشە و نەگەیانەوە . **بێکەیف**: بێ شادی، بێ خۆشی.هەوەس:زەوق . **کردین**:کرداری ئەنجام دانە. **فەخر**:شانازی .**عەرەب**:

گەلی عەرەب . **تورک:** گەلی تورک . کورد گەلی کورد . **میللەلی تر:** میەللەتانی تر گەلانی تر، خەلکانی تر . **بووی:** هەبووی .**بێ روخ:** بێقەلا،ناوی داشێکی شەترەنجیشە. **شا:** مەلیک، ناوی داشیکی شەترەنجیشە. **ئەسسپ:** فەیەس ئاژەلێکی نەجیبە و بۆ سوار بون بەکار دێت ،ناوی داشێکیشە لە شەترەنج.
**کردین:** کرداری ئەنجام دان .
**ئەی:** وشەی هاوارە لەدەست داخ و کول وئازاردا،بۆ بانگ کرنیشە **باوە:** باوکە،بابە.**ئەتۆ:** خۆت ،تۆ، یانـاوی دوەم کەسی تاکە **بابی:** بـاوکی گە ورەی. **ئێمە:** یاناوی کۆی یەکەم کەسە.**فوقەیا:** هەژاران **بووی:** کردارە لە بوون،هەبووی. **سا:** کەواتە.
**لەم یۆژە:** لەئیمیۆکەوە،لەم کاتەدا. **لەهەرجێ:** لەهەموو شوێنێ ،لە هەرجێگایێ **بێجەیەست کردین:** بێ دەنگ و ئاوازت کردین،بێ سەروسەدات.کردین .
**مەعلوومە:** دیارە،ئاشکرایە،یوونە. **کەتۆ:** کەواتۆ. **کەبنالێنین:** کەهاوار بکەین لەتاوان. **بۆدەرد:** لۆئازار. **دل:** سەرچاوەی خوینی لەش . **سەد:** ژمارەی سەد.
**کەس:** شەخس . **بێ هەوەست کردین:** بێشادی و زەوقت کرین . تاریخ: بەروار ، مێژوو. **تۆم:** مەبەست شێخ مەحمودی نەمرە. دانا: دیاری کرد،نوسیمەوە سمیەغش بو: واتە سالی وەفاتی شێخ مەحمودی نەمر دەکاتە1956
**هاوارە:** وشەی بانگ کردنە لە تەنگانەدا کە داوای یارمەتی دان لە خەلکی تر بکەیت و هاواری بۆ بەریت .**هەموو:** گشت . شار: مەدینە،ژیان ونیشتەجێ بوونی خەلکیکی زۆربە یەکەوە. **دەشتی :** نازناوی شاعیرە .**کەبەست کردین:** ژیان تالت کردین ،**کەبەس:** واتە گوژارک .

---

**مانا بە پشتی :**
ئەی سەروەر و ئەی شاهی سلیمانی بەم کوچ کردنەت و مال ئاوایی کردنەت لیمان بێ باب و بێ خزم و کەست کردین ، لەبەر چی لەو وەختە ناسکەدا تۆ بۆ هەمیشە بێ پشت و پەناو یارو کەسانت کردین،خۆ فریشتەی روحکێشان بە هیچ شێوەیەک بە هاتنی ئەجەلێ هەرکەسێ لێی لاناداتن و دەبێ گیانی بکێشێ ، هەر لەبەر ئەوەشە کەوا تۆ لە گولزاری ژیانی خوتدا ئاوا بێ بەشت کردین ، تۆ کەئەولادی عەلی بووی و هەر خۆشت خۆت کەرراری ئەم رۆژگارانەی خۆت بووی ومرۆیەکی هێژاو مەزنو سەروەربووی، لەگەل ئەوەشدا بەم سەفەرکردنەت بێ هیواو شادی و خۆشی و بێ هەوەست کردین و دلت پی لە ئازار و خەم و پەژارە کردین ، خۆ تۆ جیی شانازی عەرەب و تورک و کورد و گەلانی تریش بووی وا ئاوا بێ پەناو بێ سەروەر و یابەرت کردین ، ئەی باوکی هێژاو مەزن ئەتۆ بۆ ئێمە باوکێکی گەورە بووی و ئێمەی هەژارو بێکەس لە هەموو شوێن و جێگایەکدا بە کۆچی دواییت وا بێ ئاوازو بێ سەرو سەدامابنەوەو دل بە خەم و ئازارو یەنجە یۆت کردین،شتێکی دیار و روونە کە تۆ(........................بەداخەوە بە هۆی

یەشبوونەوە چەند وشەیەک نەخوێندرایەوە) تاوەکو ئێمە بنالێنین ، تۆکە هیواوئاوات و هەتوانی دلی سەدان دەردەداران و دل بە ژانان بووی وائێستاکەش بەم کۆچ کردنەت ناشاد و دوورلە خۆشی و شادیت کردین و بێ تۆی ئازیز و سەروەر ماینەوە،وامنی دەشتی رۆژی وەفاتی تۆم نوسیەوەکە دەکاتە سالی 1956،.هاوارە ئەی خەلکی شاری و دەشتی وا کۆچی دوایی ئەو سەروەرە نەمرە و هێژایە، ژیان تال و پی لە دەردو ئازارو خەمی کردین .

دەشتی وەکو نیشتمانپەروەێکی دلسۆز و بە وەفا بۆ کورد و کوردستان هەمیشە پەرۆشی کارەسات و بە سەرهاتە تال و ناخۆشەکانی میللەتەکەی خۆی بووە تا توانیویەتی لە پێگەی نوسین و شیعرو خوتبەکانی یۆژانی هەینیەوە خزمەتی بە کێشەی میللەتەکەی خۆی کردوەو باسی ژیانی کومەلایەتی و هەلس و کەوتی یۆژانەی خەلکی کوردەواری کردووە و هیچ ترسێکی لە داگیرکەران و زۆردارانی کوردستان نەبووەو هەمیشە چقلی چاوی چەوسینەرانی گەلی کورد بووە،هەروەک شیعری بۆ یەکگرتن و یاپەیین وهیوای سەرکەوتنی شۆیشەکانی گەلەکەی نوسیوە،ئاواش بۆ کارەسات و یوواوە تالەکانی کوردستان دلی سوتاوەو هەستی پاکی خۆی بە شیعری نیشتمانپەروەری دەربییوە، دەبینین کە بە وەفاتی زاتێکی وەک شێخ مەحمودی نەمر لە یۆژگاران و سەردەمی ژیانی دا چۆن دەروونی خۆی والا دەکاتەوەو خەم و ئازار دای دەگرێت و دەردی دلی دەردەبیێت و شین بۆ نەمان و کۆچی دوایی قارەمانێکی وەک شێخ مەحمودی نەمر دەگێیێ و گەلی کورد بە خاوەن پرسەو لە دەست دانی سەروەرێکێکی ئاوا مەزن دەزانێت و ئازار و خەم و دلتەنگی دای دەگرێت ویەنجی دەدات و یادی وەفاتی سەرکردەیەکی وەک شێخ مەحمودی نەمر دەنوسێتەوە و ئاخ و حەسیەتی دەروونی خۆی دەر دەبیێت و باسی وەفاتی ئەو زاتە مەزنەیە دەکاتن دەشتی لە سەرەوەی ئەم شیعرە نوسیویەتی و دەلێت(دەشتی لە خوسوس وەفاتی مەلک نقاب شێخ محمودی سلێمانی خودا عەفووی بکاتن).

دەشتی نیشتمانپەروەر و دلسۆز بۆ خاک و نەتەوەی کوردی چەوساوەو بێ مافی ئازادی و سەربەخۆیی هەمیشەتێنووی ژیانێکی پی لە سەربەرزی و یزگاری و ئازادی کورد و کوردستان بووەو لە یۆژگاروانی خۆی دا هەستی بە ژێر دەستەیی و نەبوونی مافی ئازادی کورد کردووە و بۆ سەرکەوتن و سەربەرزی گەلی کورد هانای بردۆتە بەر شیعری نیشتمانی و وتارەکانی یۆژی هەینی و ئاگادار کردنەوەی یۆلەکانی میللەتی کورد و داوای یەکێتی و هەول و خەباتی لە پێناو ئازادی و سەربەخۆیی کوردکوردستتان ی کردووە..

*

## بۆ یارەکانی کـــۆن

بــۆ یــارەکـانی کۆن و بەگزادەکانی ســــــــەروەر
ئـەم نامە وا دەنێـرم پــڕعەترو پڕ لە شـــــەککەر

ئـــەولادی مــیری مــیران ئـــەولاتـری وەزیـــــران
بیســـتومـە مــیرە ئێسـتا شێربەچچەکـاکە ئەنــوەر

خـــاوەر زەمیـنە ئێسـتا ڕوناتـــریـنی لەهـــەرجــێ
باعیس بە شێروخورشید شــــومشادی پڕلەجەوهـەر

تائەولە پشت گـەلی بێ دوژمن کەمشـــت گەلی بــێ
یەک لەحزەنابێ هیچ کەس تاجی بچێتە ســەرســەر

شـــێرزاد و شـیر لە شــێخزاد نیشانەبۆ ڕیاســەت
بۆنامی دەســـــت و خەنجەر بۆ جامی پڕ لەکەوســەر

یاڕەببی تەخت وبـەختی بۆ ئێش وکاری ســـەختی
هەردەم هەبێ لە دونیـا تـــا وەقـتی ڕۆژی مەحشەر

دل هاتە ســــــــەر هەوایی بێـتواتە بۆ نـــەوایی
بولبول لە گەل جودایی بۆ نەغمــە هـــاتە بەر دەر

ڕوباری پـڕ شـــــــەیابی بن زیخ و ئاوەکـــەیتی
کانوویی ڕیسـە حـــەوزی کانـی مەحـــانە گەوهەر

بۆ گەنجـەکانی کاڕەش ســەد قــافلـەیی سەلامـم
بۆمەردەکانی بێ غەش دانێ ســـەبادانێ لە وێندەر

لەئیخـــــــــتیارەکانی ئەووەل دەبێ  چ  کەسـیان
مـابێ کە بــۆی بنێرم  ســەلامی خوای  ئەکبــەر

بیستومە عالیــاغــە و مەحمــودی حاجــی عـەولا
مردوونە، خــوا عـــەفویان  بکا لە هەر موکـــەدەر

زانیومە ماوە حـــــەمـدەن ،ئەولادی ئاغا مەحمـود
ئەحمـەد لە عالیاغەش قـــــادر نەجیب و ئەفخـەر

خدریش لەحاجی عەولا ماوە بچـــێ لە جێی ئـــەو
تەوفیق بکا لە بۆ وان هـــەردەم خودا مـوقـــەددەر

ئایـا دەبـێ، حـــەمەد مســـــــتـەفا لەوانە مـابـێ
پڕلە نەشـــئەونەوا بێ،لەو عەسری بێ سـەروبـەر

قـادر کوڕێکی ئەحـــــــمەد نابۆ لەوێ بوو لـەوەدەم
یاڕەببی خـوایە بیکەی بۆ ئیشـی دین مـوزەففـــەر

دەشتی کـــە یـادی ئێوەی ســـەبا بەسـەر دەهـێنێ
کوورەی دلی دەســـوتێ ئـــاهـی دەگـــاتە وێنـــدەر
*

**مانای وشەکان**:
**یارەکان** : هەڤالەکان ،خۆشەویستەکان ، **کۆن**: دیرین . بەگزادەکانی **سەروەر**: رۆلەمەزنەکانی هێژاو خۆشەویست .
**ئەم نامە**: ئەم پەیامە، ئەم نوسراوە .**دەنێرم** : وەیێ دەکەم .**پێ** : تەژی . **عەتر** : بۆنی خۆش ، گولاو . **شەککەر** : شیرینی ، شەکر .
**ئەولادی** : کویانی ، یۆلانی . **میری میران** : سەرکردەی سەر کردان ، پاشای پاشایان گەورەی گەوران . **ئەولاتری** : لە سەرەوەتری ، لە هەورازتری ، لە پێشتری ،بەرزتر. **وەزیران** : شالیاران .
**بیستومە** : زانیومە ،گوێ بیست بوویمە، گوێم لێ بووە . **میرە**: سەرکردەیە، گەورەیە.**شێر بەچچە**:مندالی شێر،رۆلەی شێر،.**کاک** :براگەورە.**ئەنوەر** : مەبەست ناوی ئەنوەربەگی بێتواتەیە.
**خاوەن** : ساحێب . **زەمین** : زەوی ،**خاوەن زەمین** : بە مرۆی مەزن دەلێن ،ئەو کەسەی کە مرۆیەکی لێ هاتوو و گەورە و خاوەن پایەی بەرز بێت ، مرۆی مەزن.
**ئێستا**:هەنوکە، ئەلئان .**یوناترین** : یۆناک ترین . **هەرجێ** : هەر شوێن .
**باعیس** : هۆ ، سەبەب . بە شیرو خورشید :ئەمەش هەر کنایەیە بۆ گەورەیی و پایە بەرزی،شیر، ئامرازی شەیە، خورشید، خۆر،یۆژ.**شومشاد**: درەختێکە کە هەمیشە سەوزە و بریقەدارە و

دارەکەشی زۆر پتەوە شتی نایاب و جوانی لیَ دروست دەکریت و لە جەنگەلەکان دا زۆرە کە ناو براوی بەو دارەوە تەشبیە کردوە.**پی لە جەوهەر**:لێرە مەبەست مرۆی خاوەن غیرەت و توانا و بە شەیەفە، زیرەک و ژیرو وریا.

**تائەو**: هەتاکو ئەو،ئەو تاوەکو.**لە پشت**: پشتیوانی ، پارێزەری . **گەلی بێت**:میللەتی بێت . **دوژمن** : نەیار،یەقیب . **مشت** : پی ، تەژی . گەلی : دۆل ، دەربەند .

**یەک لەحزە**:سانییەیەک،چرکەیەک .**تاج**: ئەو کلاوەیە کە پاشایان لەسەری دەکەن نیشانەی پاشایەتییە . **بچێتەسەرسەر** : لە سەری بنیَ ،لە سەری بکات .

**شێرزاد**:،ناوە،یۆلەی شێر ،دلێر ،ئازا.**شیر**:مەبەست شیری دایکە.**شێخزاد**: لێرە مەبەست کچی گەورە پیاوانە کە دایکی ئەنوەربەگە.**نیشانە**: بەلگە.**بیاسەت**: سەرکردایەتی ، یابەرایەتی .

**بۆنامی** : بۆ ناوبانگی ، بۆ دیاربوون ،بۆ گەورەیی. **دەست و خەنجەر** :خەنجەر بە دەست ،کنایە لە ئازایەتی و نەترسان و سەروەریە. **بۆجامی** : بۆ بادەی ، بۆ جامی سەروەری، **کەوسەر**:مرۆی گەورەو میهرەبان و ئازا،ناوی یوباێکە لەبەهەشت.

**یایەببی** : ئەی خودایە.**تەخت** :کورسی .**بەخت** : شانس . **ئیش و کار** : کار وبار **سەختی** : گرانی ،ناخۆشی .

**هەردەم** : هەمیشە . **هەبیَ** : مەوجودبێت . **لە دونیا** : لە جیهان .**تاوەقتی** : تاکاتی یۆژی.**مەحشەر** : یەستاخیز ، واپەسین .

**روبار** : نەهر ، چۆم .**پی** : تەژی ،مشت . **شەراب** : خواردنەوە .**بن** : ژێر. **زیخ** : شن ،وردەبەردی زۆر ورد .

**کانووی ریس**: ناوی کانیەکە لە بێتواتە .**حەوزی** : شوینی ئاوە کە لێی کۆ دەبێتەوە.گۆمی ئاو . **کانی مەحان**:ئەمەش هەر ناوی کانیەکە لە بێتواتویە .**گەوهەر** : ئەسل ، نەژاد ،بەردێکی بە نرخە وەک مرواری و ئەلماس و فەیروزە .

**بۆ گەنجەکانی** : بۆ لاوەکانی . **کایەش** : ناوی تیرەیەکە لە کوردەواری .**سەد قافلە**:سەد کاروان . **سەلام** : رۆژباش , سلاو .

**بۆمەردەکانی**: بۆ پیاوەکانی ، بۆ ئازاکانی ،بۆدلێرەکانی .**بیَغەش** : پاک ،دلسۆز .بیَ فرت و فێل . **دانیَ سەبا** : سروە لە وێی دابنیَ ،سروە بیبە . **لەوێندەر** : لەوشوێنەمەبەست ئاوایی بێتواتەیە.

**لە ئیختیارەکان** :لە گەورەکان ، لە بە سالاچووەکان ، لە پیرە مێردەکان.**ئەوەل** :پیشان یەکەمجار .**دەبیَ ئێستا** : ئێستا دەبیَ . **چ کەسیان** : کێیان ،کامەیان .

**مابیَ** : نەمردبیَ ،لە ژیاندا مابیَ .**کە بۆی بنێرم** :تاوەکو رۆژباشی لیَ بکەم ، سەلامی بۆ بنێرم ، هەوالی بپرسم .**خوایی** : یەزدانی . ئەکبەر : گەورەتر ، زۆر هێزا .

**بیستومە** : زانیومە:**عالیاغە و مەحمودی حاجی عەولا**:ناوی ئەو ناسیارانەی دەشتینە کە لەو سەردەمانەی لە بێتواتە بوونە و لە کاتی نامە نوسینەکەیدا مردوون و نەماون.

**مردوونە** : نەماون :**خوا عەفویان بکات**:خوا لیٚ یان ببوریت **.لە هەر موکەددەر**: لەهەموو گوناهێک ، لە هەر نالەباریەکی ژیانیان کە کردویانە.

**زانیومە**: بیستومە.**ماوە** :نەمردوون ،لە ژیان دایە. **حەمدەن** : سوپاس بۆ خوا.

**ئەولاد**:مندالان .**ئاغا مەحمود** : مەحموداغا ، ناوی یەکێکە لە بێتواتە ژیاوە .

**ئەحمەد لە عالیاغە**:ئەجمەدی کویی عالیاغە.**قادر**:ناوێکە،**نەجیب** :بەڕیز ،روح سوک.**ئەفخەر**:جێی شانازی ،شایستە.

**خدرلەحاجی عەولا**: خدری کویی حاجی عەولا.**بچیٚ لە جێی ئەو**:جێگەی ئەو بگرێتەوە.

**تەوفیق**:سەرکەوتو.**بکالەبۆوان** :بۆئەوان وەدیبێنیٚ .**هەردەم** : هەمیشە **موقەددەر**:یوداو،پێشهات .

**حەمەد مستەفا**:ئەمەش هەر ناوی یەکێکە لە دانیشتوانی بێتواتە کە لەو سەردەمانەدا لەویٚ ژیاوە و ناسیاری دەشتی بووە ،**لەوانەمابیٚ** : لەوان نەمردبیٚ ، هەر مابیٚ لە ژیـــان و سەلامەتی دا بێت.

**پیلە نەشئەو نەوابیٚ** :پیلە دلخۆشی و شادی و بەختەوەری بێت .**لەوعەسری**:لەم یۆژگارەی. **بیٚ سەروبەرە**:ناڕێک و نالەبارە.

**قادرکویی ئەحمەد نابۆ**:ناوێکە لە دانیشتوانی بێتواتە لەو سەردەمانەدا، خەلکی بێتواتەیە .**لەویٚ بوو لەودەم**:لەوکاتە لە بێتواتە بوو.

**یایەببی خوا**:ئەی خوایە.**بیکەی بۆ ئیشی دین موزەففەر**:بۆکاروباری ئاینی سەرکەوتووی بکەیت .

**دەشتی** : نازناوی ماموستامەلاخدر عەبدوللا کویی ئەحمەد نانەکەلیە. **کە یادی**: کە بیری . **ئێوەی** :یاناوی دوەم شەخسی کۆیە، هون .ئەنگـۆی . **سەبا** : سـروە شنە. **بەسەر دەهێنیٚ**: دێنێتە یادی ، وەبیر دەخاتەوە .

**کوورە**:هەر شوینیٚ کە وائاگری تیا بکریتەوە ، کورەی ئاور.**دل** :قەلب .**دەسوتیٚ** : گیی تیا بەردەبیٚ ،ئاگری تیادەکرێتەوە،بە ئاگردادەگیرسیٚ . **ئاهی** : هەناسەی پی حەسیەتی.**دەگاتە وێندەر**: دەگا بەوێندەر،دەگا بەبێتواتە.

---

**مانا بە پشتی :**

بۆ یارو خۆشەویستە دیرینەکان و سەروەرانی هێژا و بەڕیز وا ئەم نامەیەم کە پیە لە بۆنی گولاوو شیرینی بۆتان دەنێرم و دەلێم ئەی یۆلەکانی دلێروگەورە پیاوان و لە وەزیران مەزنترو هچژاتر ،من زانیومە کە کاکە ئەنوەری یۆلەی شێر، ئێستاکە گەورەیە و خۆی خاوەنی سەروەری و پی لە یۆناکی و نیشانەی ئازایەتی و دلێریە ، هەتاکو ئەویش پشتوانی میللەتی خۆی بێت و ئەگەر

دوژمنان و نەیاران پیاو پیی دۆل و چیایان بن کەسێک نیە کە تاجی گەورەیی و سەرکردایەتی بچێتە سەری، ئەو کەسەی کەنەوەی شێرە و شیری گەورە ژنانی خواردوە ، بۆ ئازایەتی و یابەرایەتی و مەردایەتی بیَ وێنەیە ئەی خودای مەزن و میهرەبان هەمیشەئەو یۆلەیە سەر کەوتوو و سەرفیرازی بکەیت و هەر پایەداروسەروەر و مەزن بێتن ، هەموو کارێکی سەخت و نالەباریشیان لە بۆیان ئاسان بکەیت و بە سەروەری و گەورەیی هەمیشە لە جیهاندا پایەداربێتن و هەتا یۆژی واپەسین ئەو گەورەیی و سەروەریە هەربۆیان بمێنێتن ، بێتواتەی پی لە شادی و خۆشی ، کە ئـاوی یوونی بن زیـخ و یوبارەکانی سەرتاپای شەیابی بە هەشـت و جوانیە }کانی مەحانْ{ و }کانووی ییسْ{ یش کە تەژی گەوهەرن و ئاوی ژیانن و پـیاو پین لە شادی و بە ختەوەری و کامەرانی،من وا لێرانەوەیا بۆ لاوەکانی کایەش و یارو هەڤالانم سەد کاروانی سـەلام و خۆشەویستی بە سروەی فێنک و خۆش و جوان بۆ تەواوی پیاوە ئازاو دلێر و مەردەکانی پاک و دلسۆزانی ئاوایی بێتواتە دەنێرم ، یەکەمجاریش لە هەوالی هەموو بە سالا چووەکان و پیرە مێردەکان دەپرسم ، کە نازانم ئێستاکە کێیان ماوە و کێان مردوە تاوەکو سەلامی خوای مەزنیان بۆ بنێرم و یەکەیەکە ناویان بەرم و بیان نوسمەوە، بیستومە کە عالیاغە و مەحمودی حاجی عەولا نەماون و مال ئاواییان لە جیهاندا کردوە و لە خوای گەورەش داواکارم کە لە هەموو گوناهێکیان ببوریَ ، بیستومە کە مندالانی ئاغە مەحمود و ئەحمەدی عالیاغە و قادری نەجیب وئەفخەر و خدری حاجی عەولا ماون و لە خوای دلۆڤانیش داواکارم کە لە هەموو خەم و ئازارێک دا بە دوور بن و هەردەم لە شادی و خۆشی دا بژین و دوورلە هەموو گیر و گرفتێک بن و بیَ وەی بن،من ئێستاکە نازانم ، ئایا دەبیَ کە حەمەد مستەفامابیَ و لەم یۆژگارە نالەبارە دا شاد و خەندان بێت؟ هەروەها قادری ئەحمەدنابۆش کە لەو سەردەمانەدائەویش لە ویندەر بوو و لەویَ دەژیاو ئێستا دەبیَ چۆن بن، ئەی خوایە هەمیشە بۆ کارو باری ئاینی تەمەن درێژو سەرفیراز و سەرکەوتو بن ، لیرە واتە لە شاری هەولێرەوە کە سروە یاد و بیرەوەری ئێوەی لە بێتواتەوە بۆ دەشتی دینیَ و هەمو خەلکی ئاوایی بێتواتە دینێتەوە ناو خانەی خەیالم و یادیان دەکەمەوە ودلم وەکوکورەی ئاور بۆ ئەوێندەر دەسوتێت و ئاە و نالەم وا ئەوەندە بەرز دەبێتەوە کەوا دەگاتە لای ئێوەی هێژاو خۆشەویستەوە.

دەشتی ماوەیەکی زۆر لە ئاوایی بێتواتە دەرسی خوێندووەو گەلیَ دۆست و یارانی لەو ئاواییە بەجیَ هێشتوەو دیاریشە ئاوای بێتواتەی گەلیَ لا خۆش بووە و گەلیَ جاران باسی ئەو ئاواییەو مێرخاسی و چاکە و دلسۆزی و نیشتمانپەروەری خەلکی ئاوایی بێتواتەی بۆ ئێمە دەگێیایەوەو دەیگوت لە ماوەی ژیانی فەقێیاتیم دا تەنیا شوێن کەوا زۆر بە لامەوە دلگیر و خۆش بووە ئاوایی بێتواتە بووە جگە لەوەش خەلکی ئەو گوندە هەتا بلێی دلۆڤان و یێزدار و دلسۆز و خانە خویَ بوون وپیاوەتی

ئازایەتی و مەردایەتی تەواوی خەلکی بێتواتە ئەوەندە زۆرە کە بە نوسین و زار ناتوانرێت و پی بە پیستی خۆیانیان بدەیتێ ،دەیگوت من هەرگیز چاکەو مەردایەتی و دلێری خەلکی ئەو ئاواییە و یارو دلسۆز و خۆشەویستەکانم لە یاد ناکەم و هەتا ماوم باسی پیاوەتی و چاکەو گەورەیی ئەو خەلکەی ئاوایی گوندی بێتواتە دەکەم و بەرامبەر هەموو یەکێک لە و کوردە پاک و دلسۆز و نیشتتمانپەروەرانە وەفادار و دلسۆزم.

دەشتی لە سەرەوەی ئەم شێعرە وای نوسیوە(کاغەزنامەی دەشتی بۆ جەنابی میران ئەنوەر بەگ وبەعزێ برادەران لە بێتواتە) کە بە داخەوە یۆژی نوسینی ئەم شیعرە نەنوسراوەتەوە بەلام ئەم شیعرە دەگەیێتەوە یۆژگارانی دوای دوور بوونەوەی دەشتی لە گوندی بێتواتەوەو گەیانەوەی بۆ شاری هەولێری دیرین..

*

## بۆنیگبەتی ئەم میللەتە

بۆ نیــگـبەتی ئەم میللەتــە بی جـــانە دڵــی مــن
بـۆ میـللـەتی ئـازوردە لـە زەلیـانــە دڵــی مــن
بـۆ حیـددەتـی ئەم کوردە لە تـرسانــە دڵی من
بـــۆ زیللـەتی ئەم کـوردە لە گریـانە دڵــی مــن

کوردینە وەرن شـــەربەتی رێکی بە دەمـاکــەن
ئەم مولکەلەدەســت عالەمـی بێگانە ڕەهـاکــەن
یەکـدی مـەکوژن ڕوویی سەناییع لـەهەوا کــەن
بــەم ئـاووری ناکـەیە ســــوتـاوە دڵــی من

خاکی وەتـەنی ئێـوەیـە هەردەم کـەدەنـــالـی
سـەد حـەیفە کـە ئەم مەعدەنە ئەڕوا بە بەتــالی
ئەمـیۆکـە ســــبەی دێتەوە بۆ حەیبی شیمـالی
بۆ سـەنعـەتی تـەییــارەیە هـــاواری دڵـی مــن

تەندوورە مەکەن ڕۆژی بەســــەرکەوتنە ئـەمڕۆ
جـــەنبوورە مەکەن ڕۆژی وەدەرکەوتنە ئـەمــڕۆ
سـەم تورە مـەکەن ڕۆژی ســەعی کـردنە ئەمڕۆ
بۆ ســــــینەمای ناتیقـە بێ نــوتقــە دڵی من

داســــووک و تەورداس و دەمپێمـەڕە تـاکـەی
دەرۆزە و و پــاڕانەوە و بێ پـــارە هـەتــاکەی
ئەم مولکەلەدەســــت لەندن و ئاسوچرە هەتاکـەی
مـەعـروفـی ئە لـەتـریک و فـەنەرگـازە دڵی مــن

گــوگردە ئەســـــوتێــەوە ئەمـڕۆ لـە زەمینـا
ئینـگلتەرە هــــات و وەری گـــرت و لـە دەمی نـا
ئێـــــوەش بە هەموو دەم سەرو مال و لە یەهینـا
شـــــیواوی کـەبـابی جگــەری کوردە دڵی من

لۆکەی وەتـــــەنی ئێوەیـە ئەمــیۆ بووە دینار
یووحی وەتەنی ئێوەیە ئەم فلســـــــی خـەریـــدار
بەم حالەیە دەشــــتی کـە دەبیٚ عـــاجــز و بیمـار
هەردەم کـە خـەفـەتخـان و بـرینـــدارەدڵی مـن
*

**مانای وشەکان :**

**بۆنیگبەتی:** بۆبەدبەختی ، بۆرەنج و ئازارو کوێرەوەری،بۆبیٚ شانسی.**ئەم میللەتە:** مەبەست میللەتی کوردە **بیٚ گیانە:**بیٚ هەست و رۆحە.**دلیمن:**قەلبی من،گیانی من. **بۆمیللەتی:** بۆ قەومی ، بۆ خەلکی ، بۆگەلی.**ئازوردە:**یەنجدیدە، ژێردەستە، دلتەنگ . **لە زەلەیانە:**لە ترس و بیم دایە .لە پەژارەو ئازاردایە لە نا ئارامی و دلتەنگی دایە.**دلیمن.** قەلب و هۆش و بیرو هەستی من .

**بۆحیددەتی :**بۆتویەیی و غەزەب و میحنەت .**ئەم کوردە:** ئەم کورد گەلە **لە ترسانە:** لە ترس و نارحەتی و نائارامی دایە . **دلیمن:** دل و هەست و بیری من .

**بۆزیللەتی:** بۆ چەوساوەیی ،بۆخەتای،بۆلەخشتەچوونی،بەمانای ژێردەستەیی و بەدبەختی و پەست بوونیش هاتووە.**ئەم کوردە:** ئەم گەلە کوردە. **لە گریانە:** لە زاری و شین یۆیۆدایە. **دلیمن:**قەلبی من،هەستی من هۆش و بیری من .

**کوردینە:** ئەی گەلی کورد.وەرن:بێن ،هەستن ،یووتێکەن **شەربەت:**خواردنەوەی شیرین .**ییکی:**یەکیتی ، یەکبوون . **بەدەماکەن:**بخۆنەوە،نۆشکەن .وەدی بێنن **ئەم مولکە:**ئەم خاکە،ئەم سەروەتە،ئەم نیشتمانە. لەدەست: لەچنگ،لە ژێردەست **عالەم:**خەلک .**بێگانە:**نامۆ،غەریب،بیانی **یەهاکەن:**ئازادبکەن یزگار بکەن ،سەربەخۆی بکەن.

**یەکدی:**یەکتر،یەک و دوو،خۆیی .**مەکوژن:** لەناومەبەن. **یوویی:**بەرەو. **سەنایع:** پیشەسازی **:لەهەواکەن:**بەرز بکەنەوە، لە ئاسمان کەن،بەرەوپێشەوەی ببەن **بەم ئاووری:**بەم ئاگری .**ناکەیەیە:**ئالودەیە،شیواوەیە خراپەیە **سوتاوە:**بەگیسوتاوە،برژاوە،گیی گرتوە.**دلیمن:** هەستی من دلیمن، بیروهۆشی من .

**خاکی:**زەوی ، زێدی ،واری. **وەتەنی:**نیشتمانی،واری ،ئاخی. **ئێوەیە:** هونە،یاناوی دوەم شەخسی کۆیە .**هەردەم:** هەمیشە،لە هەموو کاتێک .**کە دەنالی:** کە هاواریەتی ، لە تاو ئازار و یەنج نالاندن .

**سەد:**سەدکەیەت،سەدجاران.**حەیفە:**ئەسەفە،مخابنە. **مەعدەن:** کان ،ئەو کانانەی کە لە نژێر زەوی دایە وەک نەوت و زێی و ،ئۆیانیۆم و ئاسن و شتی تر.

**ئەیوا:**دەیوا، ون دەبیٚ،دەبردریٚ .**بە بەتالی:** بەخۆیایی،بەبیٚ ســود، بە فییۆ.بەلاش .

**ئەمیۆکە:**ئەویۆکە،ئەمیۆژەی کە تیا داین.**دێتەوە:**دەگەیێتەوە . **بۆحەیبی:**بۆ جەنگی ، بۆشەیی . **شیمالی:**سەرو،کەمەبەست کوردستانی باشوورە.
**بۆسەنعەتی:**بۆ پیشەسازی ،بۆ دروست کردنی .**تەییارەیە:** فیۆکەیە، بالافیە.
**هـاواری:** بانگ کردن،هاوار لە تاو ژان و ئازاران،دادو فیغان.**دلیمن:**قەلبی من، هەست و بیر و هۆشی من .
**تەندوورەمەکەن:**خۆمەخافلێنن ،خۆتان لە بیرمەکەن . **ی.رۆژی:** کاتی،یۆژگاری.
**بەسەرکەوتنە:**بەسەر دوژمنان زال بوونە، رزگاری و ئازادبوونە. **ئیمیۆ:** ئەویۆ،ئیرۆ.
**جەنبوورەمەکەن** : خۆتان مەبەستنەوە و هەولێ بدەن ،بەو لغاوەش دەلێن کە بـۆ ئەسپی بەکاردێنن ،.**یۆژی:** کاتی. **بەدەرکەوتنە:** وەختی دیاربوونە،کاتی ناوبانگ دەرکردنە.**ئەمیۆ:**ئیرۆ ،ئەم یۆژە،ئەم کاتە.
**سەمتۆرە:**شەرم مەکەن .**یۆژی:**کاتی ،وەختی،دەمی.**سەعی کردن:**کۆشش کردن، هەولدان تێکۆشان.ئیمرۆ:ئیرۆ،ئەمیۆ .
**سینەما:** سینەمای فیلم و شوێنی بینیی فیلم و نمایش و تابلۆو حەیەکاتی هونەرپیشان بە هۆی دەزگای کامیرا و کارەباوە. **ناتیق:**خاوەن گوفتار،قسەکەر .**بێ نوتق:**بێ قسە لە حەژمەتان .واق ویماو لە تاوان **دلیمن:**هەستی من هوشی من ،دلی من ..
**داسووک:**ئەوئامرازەیە کە بە شێوەیەکی زۆر سەرەتایی بۆ دروێنە بە کاردێت
**تەورداس:**ئەوئامرازە دەست کردەیە کە بۆکاروباری دار بیین و وردکردن وبیینی شتی تر پەلپەل کردنی شتی یەق بە کار دێت .**دەمپێمەیە:**ئەو ئامرازەیە کە بۆ هەلکەندن وچال کردنی زەوی بە کار دێت . **تاکەی :** هەتا کەینێ .
**دەریۆزە:**داوای پول و پارە کردن و دەست پان کردنەوە بۆ ژیان بۆ خەلک،دەرۆزەکردن.**پایانەوە:**خۆ دەخیل کردن و پەستی نواندن .**بێ پارە:** بەبێ پول و ژیان .**هەتاکەی:** تا کەنگی ، هەتا کەینێ.
**ئەم مولکە:** ئەم خاکە، ئەم نیشتمانە . **لە دەست :** لە چنگ ، لە ژێردەست . **لەندەن:** مەبەست ئیستعماری بریتانییە ،**ئاسوچرە:** مەبەست سویسرایەئەو وەلاتەیە کە پەیمانە شومەکانی دژی کوردی لێ بەستراوەو بییاری مانەوەی کورد بەبێ وەلات و دەولەتی لێ دراوە بۆ بەرژەوەندی عوسمانیە داگیرکەرەکان .
**هەتاکەی:** تا کەنگی ، تاکەینێ.
**مەعروفی :** ناسراوی . ئەلەکتریک:کارەبا، ئەلەکترۆن .**فەنەرگاز:** چرا و دەزگاکانی یۆناکی و کار و باری تر کە بە گاز کار دەکاتن . **دلیمن:** قەلبی من ،هەستی من .
**ئینگلتەیە:**بریتانیا،ئینگلیز. **هات و :** گەیشت ،هاتە مەیدان. **وەری گرت:**داگیری کرد، دەستی بە سەراگرت .**لەدەمینا:**خواردی ، بردی ،قوتی دا، لە زاری نا،یان لە خوێنی نا .

**ئێوەش:** ئەنگۆش،هونیش ،یاناوی دوەم شەخسی کۆیە .**بە هەموودەم:** لە گشت کاتێ.**سەر:** یەئس .**مال:**سەروەت،دارایی . **لە یەهینا:**لەگرەودانا.
**شێواو:** تێکچوو،بلاو،بێ سەرو سامان .**کەباب:**قیمەی بە ئاگربرژاو. **جگەر:** هەناو
**کورد:**میللەتی کورد ،خەلکی کورد،ئەو میللەتەی کە 40 ملیۆن کەسە و تا ئێستا مافی ئئازادی و سەربەخۆیی لێ حەیام کراوەو داگیرکەرانی کوردستان خاک و هەموو سەروەت و سامانیان لێ زەوت کردووەو بە دەستی زۆر داری و ستەم دەچەوسێتەوەو لە ناو لانەو کاشیانەی خۆی دا مافی ئازادی و سەربەستی و یەهایی نیە.**دلیمن:**هەستی من ، قەلبی من .
**لۆکە:** پەمۆ .**وەتەن:**نیشتمان،وار،ئاخ ،هەوار،خاک .**ئێوە:** یاناوی دوەم شەخسی کۆیە،هوون،ئەنگۆ. **ئەمیۆ:** ئیرۆ،ئێستاکە،ئەویۆژەی کەتیا دەژین **بووەدینار:**کراوە بەدینار و خراوەتە بە زایەوە.
**یوحی:**گیانی.**ئەم فلسە:** بچوک ترین وەحدەی پولی ئیراقی . **خەریدار:** کییار.
**بەم حالە:** بەم شێوە. **دەشتی :** نازناوی شاعیری هێژا مەلاخدر نانەکەلیە . **عاجز:** خەمبار ،دل بەخەم . **بیمار:** نەخۆش ، پی ئازار و دەرد
**هەردەم:** هەمیشە، لە هەموو کاتێ. **خەفەتخان:** پی لە خەم و پەژارە و یەنج و میحنەت . **بریندار:** زامدار .**دلیمن:** قەلبی من ، هەستی من .

---

**مانا بە پشـتی:**

وا دلیمن بۆ ژیانی پی لە ئازار و رەنج و بەدبەختی و بێ شانسی و چەوساوەیی و نالەباری و زیللەت و یەتێنراوی و بێ سەرو سامانی ئەم کوردە هەردەم پی لەخەم وئازارو دەردو جەفایە لە تاوئەم کوێرەوەری و نەهامەتی وئازارانەی ئەم کوردە گیانم لە بەردا نەماوە و هەمیشە لە نا ئارامی و پی لە میحنەت و ترسدا دەژیم و دل بە خەم و پی لەحەسیەت و ئازار و یەنجم بۆ گەلی کوردی هەژار و چەوساوەی ژێر دەستی نەیاران.

ئەی گەلی کورد وەرن هەموو لە هەمووبە یەکەوە یەکتری بگرن و دەست لە ناو دەستی یەک بنێن و ئەم خاکە یەنگینەی کوردستان لە دەست بێگانەو داگیرکەران یزگار بکەن و ئیتر بەسە چیتر یەکتر مەکوژن و یوتان لە پێشکەوتن و سەربەرزی و سەرفیرازی بکەن و پیشەسازی کوردستان بەرەو پێشەوە بەرن و بەرزی بکەنەوە و یۆ وەلاتی خۆتان زاناو ژیروهوشیارو دلسۆزبن ،وادلی من لە تاواگەلی کورد و کوردستانی داگیرکراو و بە ئاگر وێرانەسوتاو و خاپوور کراو و نەبوونی ژیانێکی ئاسودەو پی لە شادی و خۆشی و نەبوونی یۆناکی کارەباو دواکەوتوویی ئەم کورد وکوردستانە هەردەم دەسوتێتن و گیی تێ بەر دەبێت.ئێوە وا دەبینن کەوا خاکی کوردستانی باوک و باپیرانی ئێوەیەکەوا ئەمیۆکە وا هەموو دارایی و پارەو گووگردی لی دەبردرێت وسەروەت و سامانی ئێوەیە وا دەدزرێتن و بە تالان دەبردرێت ،سەد حەیف و مخابنە کەوا ئەم هەموو کان و مەعدەنەی کوردستان ئاوا

بە فیرۆ دەیوات و دوژمنان وادەیبەن وتالانی دەکەن ، گەلی کوردیش هیچ سوودێکی لێ وەرناگرێتن و لێی بێ بەشە، هاکا بینیت دیسانەکە نەیاران و دوژمنان بۆ پەلامار دان و شەیی کورد وکوردستان هاتنەوە، هەر بۆیەشە و لە بەر ئەوەشە کەوا دلی من هەمیشە پی لە پەژارەو رەنج و ئازارە و بۆ پێشکەوتن و گەیشتن بە پیشەسازی و فرۆکە دروست کردن و یوو لە ئاسمان کردن وبەرەو پێشەوە چوونی زانست و تەکنیک و زانیاری لە کوردستان دا وا هەردەم داد و هاوارو فیغانیەتی ، دەسابەسە چیتر ئاوا بێ سود و بێ کەلک مەوەستن ،وا ئەمیۆکە یۆژی بەسەر کەوتن و یۆژگارانی پێشکەوتن و سەربەرزی میللەتانە ، تاکەی ئێوەش ئاوادوا کەوتووو نەزان و هەروا لە داواوە دەبن و بەم شێوەیە وا بێ بەرهەم و سود بۆ میللەتی کورد دەبن ، بەسیەتی چیتر ئاوا خۆتان مەخافلێنن وچیتر بەم شێوەیە نالەبارە بەبێ سودوقازانج بۆ کورد و کوردستان مەبن،ئەمیۆکە یۆژی ئەوەیە کە خۆتان وەدەر بخەن و ئازادی و سەربەخۆیی وەدەست بێنن وکوردستانی خۆتان یزگار بکەن بەسە هەتاکەی وا بەم جۆرە چاو دادەگرن و چەوساوەی دەستی نەیاران و داگیرکەران دەبن،ئەمیۆ یۆژی هەول و خەباتە یۆژی یاپەیین و رزگار بوونی گەلانە لە ژێرچنگی داگیرکەران ونەیاران دا، وا دلی منی پی لە ئازار و خەم لە تاو سینەمای دەنگدارو سیمای پێشکەوتن وزانیاری سەرچاوەی شارستانیەتی و پی لە پێشکەوتنی ئەم یۆژگارە بێ هەست ونستەوە لە ناو خەم و یەنج و نەهامەتی دایە.

ئەی یۆلەکانی گەلی کورد هەتاکەینی هەرئاوا بە دوا کەوتویی و نەزانی دەمێننەوە،تاکەی داسوک و تەورداس و پێمەیرە ئامرازی سەرەتاییەکانی کار و کاسبی ئێوە بێتن،تاکەی ئاوا بێ پارەو پول ونەدار دەبن و ئاوا لەبەر داگیرکەران دەست پان دەکەنەوە ولێیان دەپاڕێنەوە،هەتاکەینێ ئەم نیشتمانە جوانەی خۆتان لە ژێر چنگی داگیرکەرانی بریــتانی و سویسرایی یزگار ناکەن ،کوردستانمان وا کارەبا و فەنەرگاز و ژیانی پی لە پێشکە وتن سەربەرزی و سەرکەوتنی دەوێتن .وا ئەمیۆکەکارەباو نەوتی یەش لە جیهاندا دەسوتێتە وەو دونیای یوناک کردۆتەوە، وا ئینگلتەرەش هاتووە و هەموو سەروەت و ســامانێکی ئیمەی بردوو و لێی زەوت کردووین و وەلاتی خۆیانیان پێ بەرەو پێشەوە برد ،ئێوەش وا لە هەمووکاتێک دا سەر ومالتان لە گرەوی ئەوان دایە و خاوەنی هیچ سەروەت و سامانێکی میللی خۆتان و شتێک نین ،بۆیەوا دلی من وەک کەباب برژاوە وو هەمیشە دەسوتێت و زۆر پەرێشان و پەژارەدار و پی لە یەنج و ئازارم، ئەی گەلی کورد سەیرێ بکەن و بیوانن وا لۆکەی نیشتمانی ئێوەیە ئەمرۆکە دەکرێتە دینار وبووە بە پارە و پول و دارایی، وا گیانی نیشتمانی ئێوەیە ئەمیۆ بووەتە ئەم فلسەپی لە نرخ و یەواج دارەی کەمایەی ژین و ژیانی ئەمیۆکەیە وپی لە نرخە و کیباری زۆرەو پی لە بییارە، دەشتی کەوا ئەمانە دەبینێ و وەلاتیشی ئاوا بێکەس و سەر و سامانەو ئاوا

